ئیسماعیل راجی فاروقی
لویس لەمیاء الفاروقی

# هونەرە ئیسلامییەکان



وەرگێڕانی:
مستەفای سەیدمینە



لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٤٦)

## ئەم کتێبە:

بێگومان هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ هەر لایەنێک لە لایەنەکانی شارستانەتیی ئیسلامیی، دڵنیامان دەکات کە قەرئانی پیرۆز هۆی هەرە گەورەی پەیدابون و بناغەی سەرەکیی داهێنانەکانییەتی، کۆتا ڕۆشنبیریی، لە ڕاستیدا ڕۆشنبیرییەکی قورئانییە، چونکە چەمکەکانی، پێکهاتەکانی، ئامانجەکانی، شێوازەکانی هێنانە بەرهەمی ... بە بێ یارمەتی وەرگرتن لە سروشی نێرراوی خوا بۆ سەر محمد پێغەمبەر «دروودی خوای لەسەر» نابن، چونکە بەبێ ئەو سروشە، نە ئایینی ئیسلام، نە فەلسەفەی ئیسلامیی، نە شەریعەتی ئیسلام، نە کۆمەڵی مسوڵمان، نە دەزگای ئیسلامیی، پەیدا نەدەبوون.

جا هەروەکو چۆن ئەم لایەنانەی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی، لە ڕووی بنەماو پاڵنەر و ئامانجیانەوە، بە ڕۆشنبیریی قورئانیی لە قەڵەم دەدرێن، هەر بەو جۆرە پێویستە هونەرەکانی شارستانیەتیی ئیسلامیش، لە بنچینەو دەرکەوتنیاندا، بە دەربڕینی ئیستاتیکیی لەو شێوەیە تەماشا بکرێن.

بەڵێ، هونەرە ئیسلامییەکان، لە ڕاستیدا هونەری قورئانین ... بەڵام: چۆن دەکرێ هونەرە ئیسلامییەکانی لە بابەتی ڕەنگ و خەت و جووڵە و شێوە و دەنگ، بە دەربڕینی قورئانی لە قەڵەم بدرێن؟



## سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا،

## ئامانجەکانی سەنتەر:

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.



**ئیسماعیل ڕاجی فاڕووقیی:**
یەکێکە لە بەناوبانگترین بیرمەندان و پسپۆڕانی توێژینەوەی ئیسلام و ئایینان لە جیهاندا. لە فەلەستین لە دایک بووە و دکتۆرای فەلسەفەی لە زانکۆی ئیندیانا لە ئەمریکا وەرگرتوە. لە «پەیمانگەی ناوەندیی توێژینەوە ئیسلامییەکان»ی پاکستان و، زانکۆی «سیراکیۆز»ی ئەمریکیی و «ماک کل» ی کەنەدیی، دەرسی گوتۆتەوە. بەشداریی دامەزراندنی پەیمانگەی جیهانیی هزری ئیسلامیی کردوە و، یەکەم سەرۆکی بووە.

..............................................

**لویس لەمیاء فاڕووقیی:**
دکتۆرای فەلسەفەی لە توێژینەوە ئیسلامییەکاندا، لە زانکۆی «سیراکیۆز»ی ئەمریکی، بەدەست هێناوە. پسپۆڕی هونەرە ئیسلامییەکان و مۆسیقایە.

..............................................



**وەرگێڕ**
**مستەفای سەید مینە**

- سالی ١٩٦٣ لە سەنگەسەر لەدایکبووە.
- خوێندنی سەرەتایی و ناوەندیی لە سەنگەسەر و ئامادەیی لە قەڵادزێ و ڕانیە تەواوکردوە.
- ساڵی ١٩٨٩ بەکالۆریۆسی لە بەشی کوردیی زانکۆی سەلاحەددین وەرگرتوە.
- ساڵی ٢٠٠٦ ماستەری ئەدەبی لە کۆلێجی زمانی زانکۆی سلێمانی وەرگرتوە.
- لە زۆربەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی باشوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان شیعر و وتار و توێژینەوەی بڵاو کردوونەتەوە.
- جگە لە نووسینی کتێبی «پایەی وەفایی»، چەند کتێبێکیشی لە عەرەبی و فارسییەوە وەرگێڕاون.
- ئەندامی یەکیەتی نووسەرانی کورد و، مامۆستای بەشی کوردیی زانکۆی ڕاپەڕینە.

# هونەرە ئیسلامییەکان

نووسینی:
ئیسماعیل راجی فاروقی
لویس لەمیاء فاروقی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە:
مستەفای سەیدمینە

چاپی یەکەم
کوردستان- سلێمانی
١٤٣٨ك – ٢٠١٧ز

# هونەرە ئیسلامییەکان

.................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٤٦)

- نووسینی: ئیسماعیل راجی فاروقی ـ لویس لەمیاء فاروقی
- وەرگێڕانی: مستەفای سەیدمینە
- بابەت: هزری
- دیزاین: رەوشت محەمەد
- چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١١٧٥)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

# ناوەڕۆک

# پێشەکی

لەکاتی باسکردنی هەر دیاردەیەك لە دیاردەکانی شارستانیەتیی ئیسلامیی، دەبێ سەرباری لەبەرچاوگرتنی بنەمای پەیدابوونی، ئامانجی دوورنومای بوونی ئەو دیاردەش لەبەرچاو بگیریت، کە هەم ئامانج و هەم بنەمای، لە قورئانی پیرۆزەوە سەرچاوە دەگرن.

لەڕاستیشدا، ڕۆشنبیریی ئیسلامیی، "ڕۆشنبیرییەکی قورئانی" یە، چونکە پێناسەو بنەماو ئامانجەکانی و ڕێگاکانی گەیشتن بەو ئامانجانە، هەموویان لە پیت و فەڕی ئەو ئایەتانەوە دێن کە خوای باڵا دەست لە سەدەی حەوتی زایینیدا بۆ محمد پێغەمبەری(دروودی خوای لەسەر) ناردوون. بابای مسوڵمانیش تەنها "ڕاستیی ڕەها" لە کتێبە پیرۆزەکەی ئیسلام وەرناگرێت، چونکە ئەو بابەتە لە یەکلاکردنەوە و چەسپاندندا، هاوتای ئەو بیرانەیە دەربارەی سروشت و مرۆڤ و دروستکراوەکانی دیکە، هەروا دەربارەی زانیاریی و دەزگا کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئابوورییەکان کە بۆ چاك بەڕێوەبردنی کۆمەڵ پێویستن – بەکورتی: لە مەڕ هەموو لقێکی زانیاریی و چالاکییە دیارەکانی مرۆڤ لە قورئاندا هاتوون – ئەمەش مانای ئەوە نییە کە دەربارەی هەموو بوارێکی زانیاریی و چالاکیی مرۆڤ، چەند لێکدانەوەو باسێك لە کتێبێکی پیرۆزدا

که (١١٤) سوورەتە، هاتوون، بەڵکو مانای ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز بنەما سەرەکییەکانی سەرلەبەری ڕۆشنبیریی و شارستانیەتییەك پێشکەش دەکات – چونکە بەبێ ئەو سروش (وحی)ە، ڕۆشنبیریی لەدایك نەدەبوو و، بەبێ ئەو نەدەکرا نە ئایینی ئیسلام، نە دەوڵەتی ئیسلامیی و نە فەلسەفەی ئیسلامیی و نە یاساو کۆمەڵی ئیسلامیی و نە ڕژێمی سیاسیی و نە ئابووریی ئیسلامیی، وەدی بێت.

جا هەروەکو چۆن گومان لەوەدا نییە کە ئەو دیمەنانەی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی، لە ڕووی بنەما و پاڵنەر و باسکردن و ئامانجەوە، قورئانین، هونەرەکانی شارستانییەتیی ئیسلامیش، دەبێ هەر بەو چاوە تەماشا بکرێن کە چەند دەربڕینێکی ئیستاتیکین کە لە هەمان سەرچاوە هەڵقوڵیون و بە هەمان ڕێرەودا دەڕۆن. بەڵێ، هونەرە ئیسلامییەکان لە ڕاستیدا هونەری قورئانین.

لەوانەشە ئەو قسە، ئەو نامسوڵمانانە ڕاچڵەکێنێ کە لەوەتی هەن ئیسلامیان پێ ئایینێکی بنەڕەتخواز (موحافەزەکار)ە، کە بتان دەشکێنێ و باوەڕی بە هونەر نییەو حەرامی دەکات[1]. ڕەنگە لە لای

---

[1]. ئەم بۆچوونە لەچەند قسەیەکدا بەرجەستە دەبێت کە هەموویان لەمەی خوارێدا کورت دەبنەوە: (هەڵبەت مەبدەئی ئیسلام لە تەنیایی خواو ئەو شتانەی وەکو مەترسیی هاوبەشپەرستیی و خواداتاشین کە بەو بابەتەوە بەندن، بۆتە هۆی حەرامکردنی سەرپاکی هونەرەکانی پەیکەرتاشیی لە بواری پەرستندا، ئیسلام وەك ڕەفتاری سەختگیریی خۆپاککەرەوان (بیوریتان)، چێژوەرگرتنی هونەریی بە شێوەو وێنە و مۆسیقاو مونەمنەمەی تەواو قەدەغە کردوە)

هەندێك لەو مسوڵمانانەش هەر سەیر بێت کە بە هەڵە لە هەوڵەکانی زانایان و نەتەوەی مسوڵمان گەیشتوون لە ئاڕاستەکردنی کارو چالاکیی هونەریی بەرەو چەند شێوەو شێوازێکی دیاریکراوی هونەرو دوورکەوتنەوە لە جۆرو شێوازی دیکە. هەڵبەت هەندێك لە مسوڵمانان وادەزانن ئەو ئاڕاستەکردنە ڕەفزکردنی هونەری ئیسلامیی دەگرێتەخۆی، نەك سەر ڕاستکردنی. دیارە هەردووك بۆچوونەکەش لەمەڕ هونەری ئیسلامیی و سەرچاوەکەی، خراپ حاڵی بوونن.

کەواتە: چۆن دەتوانرێ بەو چاوە سەیری هونەرە ئیسلامییەکان بکرێت، کە بریتین لە چەند دەربڕینێکی قورئانی لە ڕەنگ و خەت و جووڵەو شێوە و دەنگ؟ سێ ئاست هەن کە لێکدانەوەیەکی لەو بابەتەیان لەسەر ڕادەوەستێ.

---

بڕوانە: (کینیپ کراك Kenneth cragg)
The House of Islam (Belmont, California, Wadsworth Publishing Co., 1975)p.15.

# ئاستی یەکەم

## قورئان یەکتا پەرستی یان بەرزیی دەناسێنێ

**دەربڕینی ئیستاتیکیی پەیام: یەکتا پەرستیی**

قورئان سروش (وەحی)ە بۆ ڕێنوێنیی کردنی مرۆڤ بەرەو بنەڕەتی تاك و تەنیایی خواو، پەیامێکە پێشتر لەسەردەمانی زوودا، بەچەندەها پێغەمبەری پایە بەرزی وەکو ئیبڕاهیم و نووح و مووسا و عیسا ڕاگەیەنراوەو، قورئانی پیرۆز دەربڕینێکی نوێ لەمەڕ تاك و تەنیایی خوا دەگرێتە خۆی، ئەو بەدیهێنەرە ئەزەلییەی ڕێنومایی گەردوون و هەرچی لەنێویدایە، دەکات . خوا لە قورئانی پیرۆزدا بەو زاتە بەرزە باس دەکرێت کە نەچاو دەیبینێ و نە هەستەکان پەی پێ دەبەن: (لا تدركه الأبصار و هو يدرك الأبصار— چاوەکان ئەو نابینن، ئەو چاوەکان دەبینێ —الأنعام "١٠" (ليس كمثله شيء— هیچ شتێك وەکو ئەو نییە— "الشورى ١") ئەو زاتە لەسەرووی هەموو وەسفێکی تێرو تەواوە و، ناکرێ لەهیچ وێنەیەکی جیهانی مرۆڤ، یان دروستکراوەکانی دیکە بچوێنرێت و، لە ڕاستیدا خوا مەیدانخوازیی هەموو پرسیارێکی وەکو:

کێ و چۆن و لەکوێ و کەی دەکات. ئەم بیرەش دەربارەی تەنیایی ڕەهای خواو بەرزیی و باڵاییەکەی، بە "یەکتاپەرستی" ناسراوە.

گومانیشی تێدا نییە دەربڕینەکانی قورئان دەربارەی سروشتی خوا، لە وێناکردنی خوا لە میانی شتە بەرهەستەکانەوە، جا چ لەشێوەی مرۆڤدا بن، چ لە شێوەی ئاژەڵدا، یان هێماکانی شێوەگەلی سروشتدا، بەدوورن، بەڵام بەشداریکردنی پەیامی قورئان لە هونەرە ئیسلامییەکان، هەر ئەوەندە نییە، چونکە دەبینین هەموو مونەمنەمەکانی[1] هونەرەکانی ئیسلامی لە لایەن بنەرەتی یەکتاپەرستیی قورئانەوە بەشێوەیەکی گەورە کاریان تێکراوە. جا لەبەر ئەوەی خوا بەتەواویی لە سروشت جیایە و جیاوازییەکەی لە دروستکراوەکانی، ڕەهایە، ئەو کاتەی ئیسلام کاروانە تازەکەی دەست پێکرد، تەنها حەرامکردنی بۆ ئەم لاو لای ویناکردنی خوا وەك شێوەکانی نێو سروشت پێویست نەبوو، بەڵکو ئەوە دەستکەوتێکی ئیستاتیکی بوو کە هەست و گیانی سامیی لەسەردەمی زوودا، کاتی عیبرانیەکان، وەدەستی هێنابوو... چونکە هەموو پێغەمبەرەکانیان بەتوندیی دژی ئەوە بوون وێنەی "یەهوە" بکێشرێت، هەروەها دووەم وەسیەتی ناسراوی شەریعەتی مووساش ڕێی لێ گرتبوو، تەنانەت نووسینی ناوی خواش، جێی هاندان نەبوو، بەڵکو ئەو چوار پیتە نەبزوێنە بێدەنگانەش، کە ناوی "یهوە"، یان کورتکراوەکانی دیکەیان

---

[1]. منمنم: وێنەی بەنەخشو نیگار ڕازاوە لە شێوەی "مینیاتۆر"یدا.

پێکدەهێنا، بەزۆریی ئـەو هێمایـەیان دەنوانـد کـە خـوای عیبڕانیـەکانی دەگەیانـد. جـا لەبـەر ئـەوەش کـە ئیـسلام دوای چـەند سـەدەیەك لـە کاریگــەریی ئیــستاتیکیی کەلــەپووریکی جیــا(یۆنــانی– ڕۆمــانیی– و کەلـەپووری هێلینـی کـە لێـی پەیـدابوو) کـە بـاڵی بەسـەر زۆر ناوچـەی ڕۆژهەڵاتی سـامیدا کێـشابوو، سـەری هەڵـدا، ئیـسلام سـووربوو لەسـەر ئـەوەی کـە پێویـستە ڕێبـازێکی نـوێ بـۆ دەربڕینـی هونـەریی بێنێتـە کایەوە، چونکە مسوڵمانان پێویستیان بە شـێوازێکی ئیـستاتیکی بـوو، چەند کارێك پێشکەش بکات، بۆ هاندانی تێڕامانی جوانیخـوازیی و چـێژ وەرگرتن و، پشتگیریی بنەمای هزرو بیری بنەڕەتیی کۆمـەڵ، تـا ببێتـە هۆکارێکی هەمیشەیی بۆ وەبیر هێنانـەوەی بنەڕەتـەکانی– ئـەو جـۆرە کارە هونەرییانە لەدەستیان دێ هۆشیاریی لەمەڕ خوای بـەرزو بـاڵا کـە بەجێهێنانی ویست و ئیرادەکەی، ئەوپەڕی مەبەسـت و ئامـانجی بـوونی مــرۆڤ خۆشــیەتی، بــە هێــز بکــەن. ئــەو تێــڕوانین و ئامانجــەش لــە جوانیخـوازیی ئیـسلامیدا، لـە ڕێگـەی وێنەکێـشانی مـرۆڤ و سروشـتەوە نەدەهاتەدی، بەڵکو تـەنها لـە ڕێگـەی تێڕامـان بـە هـۆی ئـەو داهێنانـە هونەرییانەوە دەهاتە دیی، کە ڕێبەدیکردن بەرەو هەمان ڕاستی بە مرۆڤ دەبەخشێت، کە خوا ئەوەندە لە دروستکراوەکانی جیاوازە، ناکرێ وێنا بکرێ، یان بە دەربڕین بنوێنری.



**وێنەی زەوی وەکو (الشريف الادريسی) لە ساڵی ٥٦٢ك /١١٧٧ز کێشاویەتی**

هەڵبەت مسوڵمانانی پێشوو لە کاتی داهێنـانی هونەریـدا، تووشـی ئـەو مەیدانخوازییە هاتوون، بۆیە سـەرقاڵی ئـەو بابـەت و شـێوازانە بـوون، کـە خـەڵکی پـیش خۆیـان لـە سـامییەکان و بێزەنتییـەکان و ساسـانیەکان، ئاشـنایان بـوون، بۆیـە هـاتوون چـەندەها بابـەت و کەرەسـتە و شـێوازی تازەیان پەرە پێداون، کە پێویست بوون، لەوەش گرنگتر چەندان شێوازی نـوێی هونـەرییان داهێنـاون، پاشـان ئەوکاتـەی مـسوڵمانان، لەگـەڵ پـەل هاویشتنی دستەڵاتی سیاسییان، بەفرەوان بوونی دەسـەڵاتی ئیـسلام لـەو شوێنانەی کـە لـە ڕۆژئـاوا لـە ئیـسپانیاوە، تـا فلیـپین لـە ڕۆژهـەڵات درێـژ دەبوونەوە، بـڵاو بوونـەوە لەچـەندان شـوێنی جیاجیـای دنیـای ئیـسلامدا ڕەنێویـان هێنـاون و گونجانـدوویانن. دیـارە ئـەو شـێوازە نوێیانـە، بـەبێ سڕینەوەی فرەییـی ناوچـەیی، یـان حـەرامکردنی، بوونـە بـەردی بناغـەی یەکیـەتی جوانیخـوازیی لـە هـەموو لایـەکی جیهـانی ئیـسلامدا. هونـەری ئیسلامی لەسەری بوو نێوەڕۆکە سلبییەکانی کە شایەتمانی (لاالـه الا الله- بیجگە لە "الله" هیچ پەرستراوێکی بە هەق نییـە) و (لـیس کمثلـه شـيء- هیچ شتێك وەکو خوا نییە) دەیگەیەنن، بگرێتە خۆی...

هـەروەها لـە بەرانبـەر ئـەوەدا، ڕەهەنـدی ئیجـابی یەکتاپەرسـتیش بگەیەنێت، ئەو ڕەهەندەی ئەو شـتانە نـا کـە لـە خـوای گـەورەدا نـین، بەڵکو ئەو شتانەی لە خوای گەورەدا هەن، دەردەبڕێت.

ڕەنگە دیارترین خەسڵەتەکانی خوای باڵادەستیش، کـە بیروبـاوەڕی ئیـسلام ڕایاندەگەیـەنێت، ئـەوە بێـت کـە خـوا هـەموو شـتێکی وەکـو دادپەروەریی و بەزەیی و زانست و خۆشەویستی دەگرێتە خۆی و، مرۆڤ

هەرچەندە لە ژماردنی سیفەتەکانی خوای باڵادەستدا، یان لە تەواو گونجاندنی یەك لەو سیفەتانەدا لەگەڵ خوادا، هەوڵ بدات، هەوڵەکەی بە هیچ جۆرێك سەرناگرێ[1]، چونکە سیفەتەکانی خوای گەورە هەمیشە لە سەرووی بۆچوون و باسکردنی مرۆڤەوەن ... ئەو ڕێکوپێکییەی نە سەرەتای هەیە و نە کۆتایی و، هەستی هەمیشەیی بوون دەبەخشێت، ئەوە ئی ئەو ڕێبازە هەرەچاکەی دەربڕینی هونەرییە لەمەڕ بنەڕەتی "یەکتاپەرستی" ... هەموو ئەو بنەمایانەش کە داهێنراون تاکو لەگەڵ ئەو ئامانجەدا بگونجێن، ئەوانەن کە هەموو هونەرەکان لەلای گەلانی مسوڵمان لێك جیادەکەنەوە. ئەو ڕێکوپێکییە بێ کۆتاییانە، بە جیاوازییە تاقانەکانیانەوە، دەستکەوتی بەرچاوی مسوڵمانانن لە مێژووی دەربڕینی هونەریدا ... لەو ڕێکوپێکییە بێکۆتاییانەشەوە دەکرێ بە وردیی نێوەڕۆکی پەیامی ئیسلام هەست پێ بکرێت.

زۆر جارانیش هونەری ئیسلامی بە هونەری ڕێکوپێکیی بێ کۆتایی، یان "هونەری بێ کۆتایی"[2] ناودەبرێت و، بەو دەربڕینە جوانیخوازانەش دەگوترێ: "هونەری زەخرەفەی عەرەبی" (ئەڕابیسك)[3]، هونەری

---

[1]. سیفەتەکانی خوا، یان ناوە پیرۆزەکانی خوا (أسماء الله الحسنى) ژمارەیان نەوەت و نۆیە، هەرچەندە وا زانراوە کە بێ کۆتایین.

[2]. بڕوانە: اسماعیل راجی الفاروقی

Islam and Culture Kuala Lumpur: AngkatanBelia Islam Malay-sia, 1980.p.44

[3]. پێناسەی وردی وشەی "ئەڕابیسك" ئەوەیە کە بریتییە لە جۆرێکی تایبەتی وێنەکێشان بە گەڵای دار یان گەڵا مێو بەشێوەی تەوەرەیی، مسوڵمانان دایانهێناوە ... "ئەرسنت کۆنێڵ"

زەخرەفەی عەرەبیش هەر هونەری "گەڵاکاریی– التوریق" کە گەلانی مسوڵمان بە ڕێك و جوانیی دەیانکرد، ناگرێتەوە[1] ... هەروەها تەنها ڕێکوپێکییەکی ڕووتی دوو ڕەهەند نییە لەسەر هونەری خەتخۆشیی شێوە ئەندازەییەکان و شێوە ڕووەکییە دیاریکراوەکان[2] بەند بێت، بەڵکو بوونەوەرێکی بنیاتگەرە لەگەڵ بنەڕەتە جوانیخوازییەکانی بیری ئیسلامیدا دێتەوە، ئەم هونەرە هەستی باڵایی بێ کۆتایی لای مرۆڤ دروست دەکات، بەوەی کە لە سەرووی شوێن و کاتە، ئەوەش بە بێ لاف لێدان دەکات، کە مسوڵمان ڕقی لێیەتی، ئەمەش لەوەوە دێت کە ڕێکوپێکییەکە بۆخۆی،

---

Ernst Kuhnel لە کتێبەکەیدا بە ناوی: The Arabesque: Meaning and Transformation of an Ornament

وەرگێڕانی: ڕیچارد ئیتنکهاوزن Richard Ettinghausen (Graz, Austria: Verlag fur Sammler .1949)p.4

دەڵێ: لە کۆتایەکانی سەدەی نۆزدەدا "ئالۆیس ریگل" (AloisRiegl) کتێبێکی نووسی، لەوێدا دیاریکرد کە ئەو زاراوە جۆرێکی تایبەتی دیزاینی زەخرەفی دەگرێتەوە، بەڵام دوایی وای لێهات زاراوەکە مەعناکەی فرەوان بوو و، زنجیرەیەکی درێژ لە دیزاینی زەخرەفی بە خەت و شێوەگەلی ئەندازەیی و ڕووەکی گرتەوە. (لوس ئیبسن فاروقی)ش لە توێژینەوەکەیدا بە ناوی: Ornamentation in Arabian Improvisational Music: A Study in Interrelatedness in the Arts " The World of Music, 20 (1978), pp,17-32.

بڕوانە هەمان نوسەر : The Islamization of the Hagia Sophia Plan

کە توێژینەوەیەکە پێشکەش کراوە لە کۆنفرانسی: The common Principles, Forms & Themes of Islamic Art

إسطمبول، نیسان، ١٩٨٤" هەروەها بڕوانە: إسماعیل راجی الفاروقی

"Islamic and Art" StudiaIslamica, 37 (1937), pp. 102-103.

[1]. بڕوانە: Kuhnel, The Arabesque

[2]. بڕوانە خۆی " Arabesque" لە مەوسوعەی ئیسلام Encyclopedia if Islam چاپی نوێی (Leiden: E.J. Brill) ج١، ص٥٥٨–٥٦١.

سەرووی خۆی دەنوێنێ- جا لە میانی تێڕامانی ئەم ڕێکوپێکییە بێ کۆتاییانەوە، زەینی وەرگر ڕوو دەکاتە خواو، سەرەنجام هونەر دەبێتە پشتیوان و وەبیرهێنەوەی بیرو باوەڕی ئایینی. ئەم لێکدانەوەی ئامانجی بوونی هونەری ئیسلامی، زۆر لە چەمکە هەڵە باوەکان، کە پێیان وایە هونەری ئیسلامیی، هونەری شێوەکاریی ڕەفز دەکات و، لەجیاتی ئەوە بایەخ پێدان لەسەر بابەتە ڕەهاکان چڕ دەکاتەوە، هەڵدەوەشێنێتەوە.

بۆ نموونە: ئەو قسەی کە گوایە مسوڵمان سروشت بە خەیاڵ دەزانێت، پووچ دەکاتەوە، چونکە سروشت لای مسوڵمان بەشێکی بەرهەستە لەوەی خوا دروستی کردوە و، ڕاستەقینە و ڕەوایەو، وەکو جیهانی مرۆڤ و ئاژەڵ، شاکارە.

لەڕاستیدا سروشت بەڵگەی تواناو بەخشندەیی خوایە.

(سوورەتی "بقرە" :١٦٤، سوورەتی "أنعام": ٩٥-٩٩، سوورەتی "یونس": ٤-٦ و زۆری دیکەش).

کەسیش بۆی نییە ئەو قسە بداتە پاڵ ئیسلام کە سروشت خراپەو، دەبێ ببوغزێنرێت، ئاخر چۆن مسوڵمان شتێك خوا بۆ سوودی مرۆڤ دروستی کردبێت بە خراپی دەزانێت؟! قورئانی پیرۆز سروشت بە جێگای شتی سەیر و شاکار و جوان دەزانێت کە بۆ سوود و قازانجی مرۆڤ ڕانوێنراون(سوورەتی "بقرە": ٢٩، ٧٨. سوورەتی "نبأ": ٦،١٦،٢٥. سوورەتی "فرقان": ٤٧-٥٠. و زۆری دیکەش).

مسوڵمان پێیوایە سروشت بەو هەموو مەزنییەی لە جۆراو جۆریی و کاملێیدا، تەنها شانۆیەکە مرۆڤ هەوڵ دەدات ویستی مەلەکووت، یان هۆکاری

هەرەبالآی لەسەر بەدی بێنێ و، مسوڵمان دەزانێ کە خوا ئەو هۆکارە هەرە بالآیەیە کە لە هەموو شتێك گەورە ترە. مسوڵمان لە هەموو بۆنەیەکی بە چاك زانین، بە دڵ بوون، پێزانین یان ئیلهامدا، بۆ دەربڕینی ئەو باوەڕە، ڕستەی "الله أكبر– خوا لە هەموو شتێك گەورە ترە" دووبارە دەکاتەوە. ئەگەر کلتوورەکان و گەلانی دیکە مرۆڤ بە "پێوەری هەموو شتەکان" بزانن، یان سروشت بە دوا بڕیاردەر بزانن، ئەوە مسوڵمان بە هەموو ئەندامەکانی لەشی، ڕوو لە خوای بەرزو بالآ[1] دەکات.

جا کەواتە هونەری ئیسلامیی ئامانجێکی هەیە کە لەگەڵ ئامانجی قورئان دێتەوە، ئەویش فێرکردنی ڕەگەزی مرۆڤ و پشتگیری کردنی چەمکی خوای پاکی بێگەردی بالآیە لە بۆچوونیاندا.

---

[1]. بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: Lois Ibsen al – Faruqi,
"An Islamic Perspective On Symbolism in The Arts: new Thoughts On Figural Representation, "Art, Creativity and Reli- gion. Ed. Diane ApostolosCappadona (New York: Crossroad Pub. Co.,1983 ). Pp. 164-178



زەخرەفەیەکی عەرەبیی ئەندازەیی:

ڕووکاری مێزێکی سەدەفچن. سەدەی بیستەم، سووریا.

## خەسڵەتەکانی دەربڕینی جوانیخوازیی یەکتاپەرستیی

پێوەندیی نێوان قورئانی پیرۆز و هونەری ئیسلامی، تەنها لە "یەکتاپەرستی" دا کورت نابێتەوە، بەڵکو لەو خەسڵەتە جوانیخوازییانەشدا کە مسوڵمانان بۆ وەدیهێنانی هەستکردن بەو بێ کۆتایی و بەرزییەی بنەڕەتی یەکتاپەرستیی قورئان دەیخوازێت، بەرجەستە دەبێت.

بەڵام ئەم بنەڕەتە چۆن لە میانی نێوەڕۆکی جوانیخوازیی و شێوەدا دەچەسپێت، تاکو ئەو هەستە دروست بکات؟ ئەم شتانەی خوارەوە ئەو هەستە وەدی دێنن:

– **ڕەهـــایی:** هەڵبـــەت ڕێکوپێکییـــە بـــێ کۆتاییـــەکان لـــە هونـــەری ئیسلامیدا، پیش هەموو شتێك ڕەهان و، لەبەر ئەوەی وێنەگەلی مرۆڤان بە تەواوی لێی دانابڕێن، ئەوە دەربارەی دەگمەنیی شێوەگەلی سرووشی تێیدا، بواری مشتو مڕی زۆر نییە، تەنانەت ئەو کاتەی چەند وێنەیـەکی نێو سروشتیش بەکاردەهێنرێن، ئەوە بۆ چەند شێوازێکی ڕێکخستن و لێ داڕنینی سیفەتی سروشتیی، ملکەچ دەبن، کە وایـان لـێ دەکـەن زیـاتر لەگەڵ ڕۆڵیـان لـە نکـووڵی کردنـی ڕێبـازی سروشـتیی لـە هونـەردا، لـە وێنەکێشانی دیاردە سروشتییەکاندا، بگونجێن.

– **بنیاتی یەکەکان:** کاری هونـەریی ئیـسلامیی لـە چـەند بەشـێك یـان چەند یەکەیەکی جیا جیا پێك دێت کە بۆ پێکهێنـانی دیزاینێکـی فـرەوانتر یەك دەگرن. هەموو ئەو بەشـانەش شـتێك پێکـدێنن کـە پێوانـەو ترۆپـك و شـاکاری هەیـە، دەتـوانرێ چـەمکەکەی لـە خۆیـدا بـە یەکەیـەکی ڕوون و ئاشکرا، بزانرێت.



هێڵکارییەك لە شێوەی ئاژەڵدا لەسەر بەرماڵێك لە قۆنیە، تورکیا، بۆ سەدەی سێزدە دەگەڕێتەوە (بە مۆڵەتی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و گەشتیاریی تورکیا).

- **پێکهاتە یەك لەدوای یەکەکان:** بێ گومان ڕێکوپێکییە بێ کۆتاییەکان بە بیسراو و بینراو و جووڵاوەوە، یان پێکهاتە یەك لەدوای یەکەکانی یەکە بنە ڕەتییەکان، یان دووبارە بوونەوەیان، یان هەردووکیان دەنوێنن.

ئیدی بەم جۆرە چەند پێکهاتەیەکی زیادەی بەربڵاوتر پێك دێنن، کە بوونی سەربەخۆی تایبەتی و ناسنامەی خۆیان هەیە.

پێکهاتەیەك لەدوای یەکە هەرە بەربڵاوەکانیش، لە کارێکی هونەریی ئیسلامیدا، بەهیچ جۆرێك ناسنامەو کەسایەتیی ئەو بەشە بچووکترانەی لێیان پێکدێن، تێك نادەن، بەڵکو ئەو جۆرە پێکهاتە هەرە فرەوانانەش بە نۆرەی خۆیان ڕەنگە دووبارە ببنەوە و، جیا جیا بن و، بە چەند شتێکی بچووکتر یان گەورەترەوە بەند بن، کە ئاڵۆزترن، ئیدی بەم جۆرە ڕێکوپێکیی بێ کۆتایی، دەبێتە خاوەنی چەند مەڵبەندێکی گرنگی جوانیخوازیی و، چەند "گۆشە نیگا" یەك، کە لەکاتی لێحاڵی بوونی پێکهاتەیەك لە دوای یەکەکانی یەکە و بوون و بابەتە بچووکترەکان، دەکرێ لێیان حاڵی بین و، لە هیچ دیزاینێکدا هەرتاکە خاڵێکی سەرەتای جوانیخوازیی، یان گەشەکردنێکی بەردەوام بەرەو خاڵێکی کۆبوونەوە، یان چەقێکی یەك لاکەرەوە، نییە.لەجیاتی ئەوە، دیزاینی ئیسلامیی ژمارەیەکی بێ کۆتایی مەڵبەند و چەقی بایەخ پێدانی تێدان و، لەبەر شێوازێکی تێگەیشتنی ناوەکیی، ڕێ نادات سەرەتا یان کۆتاییەکی یەکلاکەرەوەی بۆ دابنرێ.

– **دووبارەکردنەوە:** خەسڵەتی چوارەمیش کە بۆ دروستکردنی هەستی بێ کۆتایی لە کاری هونەریدا پێویستە، بریتییە لە ئاستی بەرزی دووبارەکردنەوە، چونکە پێکهاتە زیادکراوەکان لە هونەری ئیسلامیدا، دووبارەکردنەوەی بابەتە سەرەکییەکان و یەکە بنەڕەتییەکان و پێکهاتە یەك لە دوای یەکەکانیان کە وادەردەکەون، وەکو بڵێی تا بێ کۆتایی بەردەوام بن، بەکاردێنن و، لێرەدا ڕەهایی، پشتیوانی پەیدا دەبێت و، بەم چڕکردنەوە تایبەتییەی بەشە پێکهێنەرەکانی بەهێز دەبێت، هەروەها لە دیزایندا نایەڵێ هیچ یەکەیەك بەسەر ئەوی دیکەدا زاڵ بێت.



درێژەی چەند نەخشێك بە فسیفسا لەسەر گۆڕی (زیندەشا) لە سەمەرقەند، سەدەی چواردەهەم (وێنەگرتنی لەمیا فاروقیی)



دریژەی چەند نەخشێك بە فسیفسا لەسەر گۆڕی (زیندەشا) لە سەمەرقەند، سەدەی چواردەهەم (وێنەگرتنی لەمیا فاروقیی)



مەکتەبی (تەڵاکاریی) لە سەمەرقەند، (١٦٤٦–١٦٦٠ز)



**بەرماڵێکی نوێژ لە تورکیا، سەدەی هەژدەهەم، (چەند پێکهاتەیەکی یەك لە دوای یەك)ی زۆر کە هەندێك بابەتی دیزاینکاریی یەکەداری تێدایە**

**(بە مۆڵەتی وەزارەتی ڕۆشنبیریی و گەشتیاریی تورکیا)**

- **بزۆزەیی (الحرکیە):** دیزاینی ئیسلامیی بزۆزەو جووڵاوە، واتە دیزاینێکە دەبێ لە میانی کاتدا بدۆزرێتەوە.

(بوئاس) پێی وایە، کارە هونەرییەکان یان پشت بە کات دەبەستن، یان شوێن[1]. لەو باوەڕەدایە ئەو هونەرانەی پشت بە کات دەبەستن، ئەدەب و مۆسیقا دەگرنەوە، بەڵام هونەرە بینراوەکان و هونەری تەلارسازیی، پشت بە شوێن دەبەستن و، "بوئاس"، سەماو دراماشی لە نێو ئەو هونەرانەدا پۆلێن کردوون کە پشت بە کات و شوێن دەبەستن و، هەرچەندە ئەم بۆچوونە لەوانەیە لە پۆلێن کردنی هونەرەکان لە ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوادا مانایەك ببەخشێت، بەڵام لە هەوڵی تێگەیشتنی هونەرە ئیسلامییەکاندا پیاو بە هەڵە دەبات، چونکە دیمەنە ڕووکەشەکان یان ئاشکراکانی کات و شوێن، بەشێوەیەکی ئاسایی لێرەدا دەگونجێن.

نووسینی ئەدەبی یان مۆسیقا بە شێوەیەکی ئاسایی لەمیانی زنجیرە ڕووداوێکی جوانیخوازیی کاتیدا مرۆڤ لێیان حاڵی دەبێ. لە ئەدەبدا لێحاڵیبوون یان لە ڕێگای خوێندنەوەی بەرهەمە هونەرییەکەوە دەبێت، یان گوێگرتن لە خوێندنەوەی، لە مۆسیقاشدا لێحاڵیبوون یان لە ڕێگەی بەشداریکردن لە لێدانیدا دەبێت، یان گوێ لێ گرتنی. — هەروا دەشکری مۆسیقا لیدان لە ڕێی "نوسراوی مۆسیقا" وە "بخوێنرێتەوە"، کە ئەوە هێندە باو نییە.

---

[1]. بڕوانە:
Franz Boas, Primitive Art (Oslo: Institullet for SammenlignendeKulturforskning, 1927)



بەرماڵێکی نوێژ لە ئاسیای نێوەڕاست (کۆمەڵەی ملحم مبارك) لە (پێشانگای هونەری ئیسلامیی)
کە "نیکۆلا سەرسەق" لە بەیرووت، لوبنان، ١٩٧٤ کردبوویەوە، پێشان درابوو.
(وێنەگرتنی لەمیا فاروقیی)

**له لایەنی دووەمیشەوە تەماشا دەکەین هونەرە بینراوەکان و هەموو پەیکەرەکانی تەلارسازیی، پشت بە ڕەگەزی شوێن دەبەستن، چونکە جێگایەکی دیار دەگرن و، چەند ڕەگەزێکی شوێنی وەکو: (خاڵ و هێڵ و شێوە و قەبارە) لە کاری داهێناندا بەکار دێنن .**

**سەرباری باوەڕ کردن بەو خەسڵەتانەی "بوئاس" ئاماژەیان بۆ دەکات، پیاو دەبێ لە باسکردنی هونەرە ئیسلامییەکاندا، ئەگەر بیەوێت بە شێوەیەکی ڕاست تێیان بگات، زۆرتر بڕوات، چونکە سەرەڕای خەسڵەتەکانی و شوێنییە ئاشکراکان، کە باسکران، کە چەند خەسڵەتێکن بە شێوەیەکی گشتیی چەمك و نێوەڕۆکیان هەیە، هەموو کارێکی هونەری ئیسلامیش بە شێوەیەکی ورد و ناسکتر لە ئاڕاستەیەکی کاتیی مەحکەم بەڵکو دەگمەندا، بەشداری دەکات، لە ڕاستیدا هونەرە بینراوەکان لە ڕۆشنبیری ئیسلامیدا، هەرچەندە بە چەند ڕەگەزێکی شوێنی ڕەفتار دەکەن، لە میانی کاتدا نەبێت، لێیان حاڵی نابین، ڕێکوپێکیی بێ کۆتاییی مەحاڵە بە ترووکەیەك، یان ساتێك، یان سەرنجێك بکەوێتە نێو بازنەی لێحالیبوون، بەڵکو چاو و زەین بە زنجیرەیەك لە شتی بینراو و جێی تێڕامان کێش دەکەن، کە دەبێ بە شێوەی زنجیرەیی لێیان حاڵی بین و، چاو لە دیزاینێکی دوو ڕەهەنددا لە ڕێکوپێکییەکەوە بۆ سەر ڕێکوپێکییەکی دیکەو، لە مەڵبەندێکەوە بۆ مەڵبەندێکی دیکە دەچێت.**



کورسیی داری ئاسایی لەسەر دیوارێکی فسیفسای شین و سپی، لە شاری
میژویی فاس لە مەغریب.

بـەو جـۆرە لێحـاڵیبوونی کـاری تەلارسازی، بە گواستنەوەی یەك لە دوای یـەك، لـە میـانی ئـەو ژوور و ڕێڕەو و تاق و گومبەزانەی تێیـدان، یان لێی جیا دەبنـەوە، دێتـە دیـی. تەنانــەت خــانووش، یــان کۆمەڵــە خانوویـەکیش، نـاکرێ لـە دوورەوە وەك بەشێکی بەسەر یەکەوە، مرۆڤ لێــی حــاڵی بێــت، بــەڵکو ئــەوەی ســەردانی دەکـات، هــەر دەبــێ لــە میــانی کاتــدا، لــە نێــو بەشــە جیــا جیاکــانی خانووەکــەدا[1] بگــەڕێ، ئەوجار تێی بگات.



وێنەیەکی وردی ئێرانی (بەهرام تەنین دەکوژێ)
جمال الدین محمد صدیقی اصفهانی.

هونەری وێنە وردکراوەکانیش، زنجیرەیەك کەسایەتی، یـان دیمـەن، کەهــەر دەبــێ بــە شــێوەیەکی یــەك لــە دوای یــەك مــرۆڤ تێیــان بگــات، دەنوێنن، هەروا لە هونەرە کاتییـە کـانی وەکـو ئـەدەب یـان مۆسـیقا و سەماشــدا هەروایــە، لێحــالی بــوونی کــاری هونــەریی ئیــسلامیش،

---

[1]. بڕوانە باسکردنی شاری ئیسفەهان، لە: Nader Ardalan&LalehBakhtiar, The Sense of Unity: The Sufi Tradition in Persian Architecture (Chicago, 1973). Pp. 97 ff.

بەشـێوەیەكی زنجیرەیـی و كەڵەكـە بـوو، جـا چ كـاتی بـن چ شـوێنی، ئەنجام دەدرێت و، خەیاڵیش ئەوەی تێدا وێنا دەكرێ كە ڕێكوپێكییـەك بـەردەوام گەشـەدەكات و دووبـارە دەبێتـەوە و، وا دەردەكـەوێت وەك بڵێی بەشێوەیەكی ناوەكیی لە لێواری تابلۆ، یان كتێب یان دیـوار، یـان رووكاری خانوو زیاتر دەڕوات. ناشكرێ قەت مرۆڤ بە شێوەیەكی تەواو، تەنانـەت لـە ڕێكـوپێكیی بێكۆتـایی تەلارسـازیش بگـات، مەگـەر دوای جووڵـەی كردەیـی، یـان خـەیاڵیی لەسـەر بانـەكانی تەلارولـەمیانی بۆشاییەكانی لە ڕیز بە ندێكی كاتیدا...

"ئەردەلان" و "بەختیار" لە تەلارێكی جووڵاو دەدوێن....

هەر دەڵێی پارچـە مۆسـیقایەكە[1] و، نـاكرێ لـە یـەك كاتـدا هەسـت بـە هەموو خەسڵەتە گشتییەكانی بكرێت، بەڵكو مرۆڤ لە دوای ناسینی پارچـە زۆرەكانی و تێگەیشتنیـان[2] نەبێ، نـاتوانێ لـە سـەرلەبەری شـتێك"گـشت" تێبگات. لەبەرئەوە ناكرێ هونەری زەخرەفەی ئیـسلامیی، هونـەرێكی بـێ گیـان بێـت، هـەروەكو هەنـدێك جـار چـەند لێكۆڵەرەوەیـەكی بەهەڵەچـوو پێیان وایە[3]، بەڵكو بە پێچەوانەوە، چێژ لێوەرگرتنی، كردارێكی جووڵـەیی

---

[1]. هەمان سەرچاوە، لـ٩٥.

[2]. بڕوانە وەسفی كتێبی جەلالەددینی ڕۆمی "مثنوی" لەلای Marshall G.S. Hodgson لە كتێبەكەیدا بە ناونیشانی: The Venture of Islam. چاپی:جـ٢، ٢٤٩-٢٧٤ (University of Chicago Press, 1974)

[3]. بڕوانە: "EnrstDiez. "A stylistic Analysis of Islamic Artt لە گۆڤاری ArsIslamica, 5(1938). P. 36

تێدایـه کـه بـەڕیز سـۆراغی هـەموو بابـەتێکی سـەرەکیی و هـەموو یەکـەو پێکهاتە یەك لەدوای یەکەکانی دەکات.

ئەوانەی لە پەیامی ئەو هونەرەو پێکهاتەکانی حـاڵی دەبـن، دەزانـن کـە لـە ڕووی جوانییـەوە[1] لـە هـەموو شـێوە هونەرییـەکان بزۆزەتـر و چـالاکترە و، دەربڕینێکـە وادەخوازێـت ناسـین و تێگەیـشتنی هـەموو هونەرە کاتی و شوێنییەکانی ناوی، بەکاتەوە بەند بێت.

– **بـەنێو یەکداچـوون:** بـەنێو یەکداچـوونی درێـژەی بابەتـەکان، خەسـڵەتی شەشـەمی هونـەری ئیـسلامییە، چـونکە بەنێویەکداچـوون توانای هەموو ڕێکوپێکییەك یـان زەخرەفەیـەکی عـەرەبی، بـۆ زاڵبـوون بەسەر سەرنجی بینەر و ئاراستەکردنی بیرچەسپاندن (الترکیـز) بۆسـەر بابەتە بنەڕەتییە وێنە کێشراوەکان، زیاد دەکات.

ڕاستەهێڵ یان شێوەی تەنیا، هەرچـەندە شـاکاریش بـن، نـاگونجێ لـە ڕێکـوپێکیی ئیـسلامیدا ببنـە تاکـە مـاددەی مونەمنەمـە، چـونکە چـەند ئەوەندە لێ کردنی ڕەگەزە نێوخۆییەکان و، زیـادکردنی بەنێویەکداچـوون، لـە پێکـەوە گونجانـدن و ئەنجامداندایـە، کـە بزۆزەیـی و دڵگیریـی لـە ڕێکوپێکیی بێ کۆتاییدا پێکدێنێ.

---

هەروەها بڕوانە: Arthur UphamPoPe, Persian Architecture The Triumph of Form and Color (New York: George Braziller, 1965). P.81.

1. بڕوانە: David Talbot Rice. "Studies in Islamic Metal Work- vi" Bulletin of the School of Oriental and African Studies (University of London), 21 (1958). Pp. 225-253.

# ئاستی دووەم
# قورئان وەك نموونەیەكی هونەریی

هونەری ئیسلامیی، سەرباری شوێن پێ هەڵگرتنی پەیامی فكریی قورئان، هونەرێكی "قورئانی" یە، بەو واتایەی كتێبی پیرۆزی گەلانی مسوڵمان، یەكەم نموونەی هەرەبەرزی شاكاری هونەریی پێشكەش كرد و، قورئانی پیرۆز بە یەكەم"كاری هونەریی لە ئیسلامدا "[1] لە قەڵەم دراوە، نابێ ئەمەش وا لە كەس بكات وا تێ بگات كە قورئان لە داهێنانی بلیمەتیی ئەدەبی محمد پێغەمبەرە (دروودی خوای لەسەر) وەكو نامسوڵمانان حەز دەكەن هەر بیلێنەوە و، مسوڵمانانیش بە توندیی ڕەتی دەكەنەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە، مسوڵمانان دەزانن قورئانی پیرۆز بە ڕوخسار و نێوەڕۆكیەوە، هەروا بە وشە و بیرەكانیەوە، خوا ناردوویەتە خوارێ، وشەكانی یەكسەر قسەی خوان

---

[1]. بڕوانە: I.R. Al-Faruqi, "Islam and Art," pp. 95-98.

و، بــە ســروش بــۆ محمــد (د.خ) هــاتوون و، ڕیزکردنــی ئایــەت و سووڕەتەکانی بە فەرمانی خوا کراوە.

وەکو لە پێشدا باسمان کرد، ئەم ڕوخسار و نێوەڕۆکە، هـەموو ئـەو خەسـڵەتە جیـا کەرەوانـەی پێـشکەش کـردوون، کـە ڕێکوپێکییـە بـێ کۆتاییەکانی هونەری ئیسلامیی دەنوێنن. قورئانی پیرۆز خۆشـی، تێـرو تەواوترین نموونەی ڕێکوپێکیی بێ کۆتاییە نموونەیەکە بۆی لـواوە کـار لە هەموو داهێنانەکانی هونەری ئەدەبی و هونەری بینراو (لە ڕازاندنەوە و لە پەیکەرەکانی تەلارسازیشدا) و تەنانـەت لـە هونـەرەکانی دەنـگ و جووڵەش [1] کە لەدوای قورئان پەیدا بوون، بکات.

قورئانیش وەکو بەرهەمێکی ئەدەبیی، کاریگەرییەکی ئیستاتیکیی و سـۆزداریی گـەورەی لەسـەر ئـەو مـسوڵمانانە هـەبوو کـە پەخـشانە شیعرەکەیان دەخوێندەوە، یان گوێیان لێ دەگـرت. چـەندەها کەسـیش لەژێر کاریگەریی جوانیخوازیی خوێندنەوەی قورئاندا مسوڵمان بـوون و، گەلێك بەسەرهات هەن باسی ئەوەدەکەن کە زۆر کـەس لـە کـاتی گـوێ گرتن لە قورئاندا، شەلاڵی فرمێسك و گریان بوون، یان مردوون [2].

---

[1]. بڕوانە: Lois Ibsen Al- Faruqi, "Dance as an Expression of Islamic-Culture,"Dance Research Journal, 10 (Spring-Summer, 1978) pp.6-13.

[2]. بڕوانە: علی بن عثمان الجلابي الحجویری، کشف المحجوب للحجویری، الترجمە الانجلیزیە. Reynold A. Nicholson, in E.J.W. Gibb Memorial Series, 17 (London Luzac& Co., 1967), pp. 396-397.

هەڵبەت زۆر جار نامسوڵمانانیش کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی قوولی شاکاری ئەدەبیی قورئانی پیرۆز، دیارە ئەو تێرو تەواوییەی قورئان، کە هیچ تێرو تەواوییەك نایگاتێ، پێی دەڵێن "موعجیزە". بەلام سەرەڕای موعجیزەبوونی قورئان و دەستەوستانیی خەڵك لەوەی کە بگەنە ڕەوانبێژیی قورئانی پیرۆز، قورئان هەر بۆتە سەرمەشقی سەر لەبەری هونەرەکان. ئەم بەشدارییەش لە ڕۆشنبیریی ئیسلامیدا شێوەیەکی تایبەتی داوەتە ئەو بابەتە هونەریی و شێوازە زۆر و زەوەندانەی وەرگیراون و بەکارهێنراون و لە گەلێك سەردەمی جیا جیادا لە چەندان ڕۆشنبیریی و میللەتەوە وەرگیراون.



کەوانەیەکی تاشراو لە کۆشکی سوور

ئەم بنەڕەتە یان نموونــەش، کــە ئــەو مــاددەو بیرانــەی وەرگــیراون، خستوونیەتە نێو قالبێك و بابەتەکانی خستوونەتە نێو بازنەی داهێنان و شـێوازە تازەکـان و، سـەرەنجام ئـەوە بۆتـە بەرجەسـتەکردنی بـاڵای پــەیامی ئیــسلام، لــە یەکتاپەرســتیی و سەرمەشــق و نموونــە، بــۆ سەرلەبەری دیمەنەکانی هونەری ئیسلامی، کە لە دواییدا پەیدابوون.

قورئــانیی پــیرۆز یەکــەم نموونــەی شــەش خەســڵەتەکانی هونــەری ئیــسلامیی، کــە لەمەوبــەر باسمــان کــردن، پێــشکەش دەکــات، یەکــەم خەسڵەتیـشیان ئەوەیـە کـە لـە جیـاتی پـیٚ داگـرتن لەسـەر وێنەکێـشانی واقیعــی، یــان سروشــتی، قورئــانی پــیرۆز نموونەیــەك لــە ڕەفزکردنــی پەرەپێدانی گێڕانەوەیی وەك بنەڕەتێکی ڕیکخراوەیی ئەدەبی، پێـشکەش دەکـات، ئـەوەتا بەشـێوەیەکی پارچـە پارچـە و دووبـارەکراوە، هەنـدێك ئامـاژە بـۆ چـەند ڕووداوێـك دەکرێـت، بـەجۆرێك هـەر دەڵێـی خوێنـەران زانیارییان دەربارەی چیرۆك و کەسەکان هەیە... جا لێرەدا یەکـەم ئامـانج گێڕانەوە نییە، بەڵکە فێرکاریی و ڕەوشتییە. ڕیزبەندیی قورئان بۆخۆشـی (کە سـوورەتە مەدینەییـە) هـەرە درێـژەکان، لەبـەر ئـەوەی زیـاتر ڕووەو پەخـشانن، لەسـەرەتای قورئانـەوە نـزیکن و، سـوورەتە مەکەییـە هـەرە کورتەکان، لەبەر خەسڵەتی زەقی "شیعریی" یان، لە کۆتاییەکەی نزیکن، خەسـڵەتی ڕەهـایی قورئـان تـۆختر دەکەنـەوە، چـونکە ئایەتـەکان نایـەن زنجیرە ڕەوشتێکی دژ یەك و ناکۆك و هەڵبژێرراو بەکار بێنن، بۆ ئەوەی بە سەختیی خوێنەر ڕابکێشن، بەڵکو خوێنەر چەند هەستێك دەیجووڵێنن، کە ڕەهاو دوور لە سیماکانی کەسایەتییەکی تایبەتی دەردەکەون. گومانیـشی

تێدا نییە ئایەت و سوورەتەکان هەست و سۆزی گوێگر دەورووژێنن، بەڵام ئەم کارە بەبێ چەند ڕەوشتێکی دەروونی تایبەتی ئەنجام دەدەن.

خەسڵەتی دووەمیش ئەوەیە کە قورئانی پیرۆز، وەکو کاری هونەریی ئیسلامیی، بەسەر چەند بەشێکی ئەدەبیدا دابەش دەبێت (ئەوانیش ئایەت و سوورەتەکانن)، کە بە نۆرەی خۆیان چەند بەشێك پێکدێنن. هەموو ئایەتێکیش، یان سوورەتێکیش، یەکەیەکی تەواوە پشت بەوەی پێش و پاشی خۆی نابەستێ و، یەکەکان پێوەندییەکی ئەندامیی ئەوەندە گەورەیان لە نێواندا نییە ناچاریان بکات کە هەر بەدوای یەکدا بێن. لە تەجویدیشدا، "ڕاوەستانەکان" بە ڕوونیی شێوەی مۆسیقاکە بەسەر چەند یەکەیەکی بیسراودا دابەش دەکەن.

خەسڵەتی سێیەمیش ئەوەیە کە عیبادەت و ئایەتەکان پێکەوە بەستراون بۆ ئەوەی چەند یەکەیەکی درێژتر، یان چەند پێکهاتەیەکی یەك لە دوای یەك، پێك بێنن. ڕەنگە ئەمانەش چەند بەشێکی کورت یان چەند حیزبێك لەنێو چەند سوورەتێکی درێژتردا پێك بێنن. بۆنموونە: دە ئایەت "دەیەك" پێك دێنن و، کۆمەڵە "دەیەك" ێك چارەگ، پێك دێنن و، کۆمەڵە "چارەگ" ێك "حیزب" ێك پێك دێنن و، دوو "حیزب" پێکەوە "جزوو" ێك پێك دێنن و، هەر سی جزوەکەش بەسەر یەکەوە، سەرلەبەری قورئانی پیرۆز پێك دێنن. هەروەها یەك ئایەتیش بۆخۆی، بەسەر چەند بەشێکی لاوەکیدا دابەش دەبێت، کە وێکچوونی مۆسیقای کۆتایی وشەکان و پیتەکانی نەرمیی، دیارییان دەکەن. کاتێك مەعناش تێکنەچێت ئەوە شوێنەکانی ڕاوەستان لە ئایەتە پێکەوە بەستراوەکاندا، دەکرێ بگۆڕێن،

چونکە لەوانەیە خوێندنی قورئان بە کۆتایی هاتنی سوورەتێك، تەواو بێت، لەوانەشە لە کۆتایی هەر ئایەتێك یان کۆمەڵە ئایەتێك تەواو بێت، تەنانەت ئەگەر دوو سوورەت یان زیاتریش بخوێنرێنەوە... مسوڵمان ئەوەندەی بۆی بلوێ لەو کاتە دیاریکراوەدا قورئان دەخوێنێ، یان گوێی لێ دەگرێ، بۆیە خوێندنەوە پێش وەخت چەندێتییەکەی دیاری ناکرێ، هەروا سەرەتاو کۆتاییشی و، نە هەستی تێهەڵچوونەوەی دوای تەواو بوون و نە هەستی ڕاوەستانی یەکجاریی دروست ناکات.

خەسڵەتی چوارەمیش لە هەموو هونەرەکانی ڕۆشنبیریی ئیسلامیدا هەیە– ئەویش زۆریی ئامرازەکانی دووبارە کردنەوەیە– کە لە شێوازی قورئانیشدا بەدیی دەکرێ، جا شێوازی شیعریی، کە لە دووبارەکردنەوەی دەنگ یان مۆسیقا پەیدا دەبێت، لە قورئانی پیرۆزدا زۆر هاتوە. سەربارێ ئەو نموونە زۆرانەی لە کۆتایی وشەکاندا هاتوون، ئەو وشانەی مۆسیقاکەیان لێك دەچێت و یەك بڕگە، یان چەند بڕگەن، قورئانی پیرۆز چەندان نموونەی لە مەڕ مۆسیقای ناوەکی ئایەتەکانی تێدان. دووبارەکرنەوەی یەکەکانی دەنگ و دەنگدارو بێدەنگەکان، ئەوەندە زۆرە، کە زیندوێتی شیعریی داوەتە ئەم بەرهەمە ئەدەبییە. ئەو عیبارەت و ڕستانەی لە کۆتایی ئایەتەکاندا دێن، چەندان جار وەدەردەکەونەوە بۆ پشتگرتنی هەر کام لە پەیامی فێرکاریی و جوانیخوازیی دووبارەکردنەوەی بیرەکان و شێوازەکانی قسەش، لە ڕەگەزەکانی ڕەوانبێژین، ئەم ڕەوانبێژییەش بناغەی ئەو بۆچوونەی مسوڵمانانە کە دەڵێن: قورئان بە ڕاستیی موعجیزەیە و، لەبەر ئەوەشە قسەی ئەزەلیی خوایە.



وێنەی زەویی وەکو (ئەبوو رەیحانی بێروونیی)کێشاویەتی، ساڵی ٣٠ك/١٠٨٤ز

خەسڵەتی پێنجەمیش کە لە هونەرە بینراوەکانی ڕۆشنبیریی ئیسلامیدا بە زەقیی دیارە– کە بریتییە لە ئەنجامدانی لە میانی کاتدا– چاوەڕوان دەکرێت لە قورئانی پیرۆزدا هەبێت، چونکە هەموو کارە ئەدەبیەکان بە هونەری کاتیی لە قەڵەم دەدرێن، بەڵام لێرەدا، وەکو سەرپاکی هونەرە ئیسلامییەکان، کردارێکی زنجیرەیی تێگەیشتن و چێژ لێ وەرگرتن هەیە، کە ناگاتە لووتکەیەکی تایبەتی و کۆتاییەك کە بە دوایدا دێت، چونکە هەستکردن بە بوونی یەکەیەکی تەواو بە شێوازی باو زۆر نییە و، خوێنەر یان بیسەر تا یەك لە دوای یەك لەگەڵ بەشە تاکەکان کارلێك نەکات، ناتوانێ لە هەمووی بگات. بەنێو یەکداچوونیش، کە خەسڵەتی شەشەمی هونەری گەلانی مسوڵمانە، نموونەی لە قورئانی پیرۆزدا هەیە. دژ یەك و بەرانبەریی و چڕکردنەوە و خواستن و لێچواندن و هێما کاریی، بەشێکن لەو شێوازە شیعرییە زۆرانەی، دەوڵەمەندیی دەربڕین و فرەوانیی درێژە پێدان لە قورئانی پیرۆزدا پێکدێنن، هەرکەسێکیش چەند بڕگەیەکی ئەم کتێبە بخوێنێتەوە، یان گوێی لێ بگرێ، بەربڵاویی ئەم ڕەگەزانە وای لێدەکات لەو هەموو جوانیی و ڕەوانبێژییەی تێیدایە سەر سام بێت!



وێنەی ٨–١١ ئافرەتێکی مسوڵمان قورئان پیرۆزی لە سەر سەر داناوە، جۆلۆ، هەرێمی سۆلۆ، فیلیپین (بە مۆڵەتی ئا.ی.وچپ).




**وێنەی زەویی وەکو ئیبراهیمی کوڕی مەجدی ئیستەخرِیی کێشاویەتی،**

**(سەدەی ٤ك/١٠ز).**

# ئاستی سێیەم
# قورئان وەك نموونەیەك بۆ وێنەكێشانی وردی هونەریی

وە نەبێ قورئانی پیرۆز تەنها ڕێبازێكی فكریی بە شارستانیەتیی ئیسلامیی بەخشیبێت، كە هونەرەكانی ئەو شارستانیەتییە لەسەری دەڕۆن، یان تەنها یەكەم نموونەی هەرەگرنگی لە نێوەڕۆك و ڕوخساری هونەردا هێنابێتە كایە، بەڵكو گرنگترین بابەتی بۆ وێنەكێشانی مونەمنەمەكان لە هونەری ئیسلامیدا داهێناوە.

بێ گومان ئەو كلتووره دوورودرێژەی بایەخدان بە ئەدەب و داهێنان لەلای سامییەكان لە سەدەی حەوتەمدا لەپێش مسوڵمانان‌دا، كارێكی چاكە. گەلانی سامیی بەهۆی بایەخدانیان بە داهێنانی ئەدەبی و هەڵكەوتنیان لەم بواردەدا، هەر لە زووەوە پەرەیان بە هونەری نووسین داوەو، نووسین هەزاران ساڵ لە شارستانیەتییەكانی وڵاتی نێوان دوو ڕووبار لە پێش ئیسلامدا، وەك ڕەگەزێكی تەواوكەری هونەرە بینراوەكان، بەكارهاتوە.

چـەندان کۆمەڵـە نووسـین پێکـەوە لەسـەر گـەلێك بـەردی تاشـراو و پەیکەری هونەریی سۆمەریی و بابلیی و ئاشووریی، دۆزراونەتەوە، ئەوە ئەگەر بە ناوهێنانی کەمێك لەو گەلانە[1] واز بێنین.

بەڵام ئـەم زیادکردنانـەی هێڵـە هونەرییـەکان لـەپێش ئیـسلامدا، بـە پلەی یەکەم ئەرکێکی شیکارییان هەبوو، چونکە نووسین بە شێوەیەکی مەنتیقی لەگەڵ شیکاری مانای وێنە و پەیکەرە بینراوەکان دەڕۆیـشت. بەکارهێنانی نووسین لـە کـارە هونەرییەکانـدا، بـەم جـۆرە بـە درێـژایی مێژووی هونەری بێزەنتی، بەردەوام بـوو. بـەڵام لـە دوای سـەرهەڵدانی ئیسلام، گۆڕانێکی قووڵ بەسەر هونـەرەکانی نووسـین و خەتخۆشـیی و ئەوانی دیکەدا هات، کە لە چەند هێمایـەکی ڕووتـەوە گـۆڕان بـۆ چـەند مونەمنەمەیەکی جوانکاریی ڕووت.

ئـەم گۆڕانـەش بـە ڕێکـەوت ڕووینـەدا، بـەڵکو ڕەهەنـدێکی دیکـەی "کاریگـەریی قورئـانی" بنـەڕەتی بـوو لەسـەر هەسـت و خەسـڵەتی جوانیخـوازیی لای مـسوڵمانان. ئامـانجی هونـەریش لای مـسوڵمان، ڕێنومایی مرۆڤە وەك جێنشینی خوای تاك و تەنیای باڵا لەسەر زەوی و،

[1]. بڕوانە: Giovanni Garbini, The Ancient World (New York: Mc Graw-Hill. 1966):

- Andre Parrot, The Arts of Assyria, tr. Stuart Gilbert and James Emmons (New York: Golden Press, 1961):
- The Great King: King of Assyria (New York Metropolitan Museum of Art, 1945).

تصویر: Charles Wheeler

ئاڕاستەکردنی بەرەو بیر لێ کردنەوەی و یادکردنی ئەو زاتە پاك و بەرزە.

بۆ ئەم مەبەستەش شتی باشتر لە ئایەتەکانی قورئان و ئەو شاعیرییەی دەیخاتە هەست و بیری مرۆڤەوە،دەست ناکەوێ. هەرچەندە خوا لە سەرووی سروشت و وێنەوەیە، بەڵام ئەو وشە پیرۆزانەی بۆ محمد پێغەمبەری (د.خ) ناردوونەتە خوارێ، بەبێ بەزاندنی سنووری شکۆی خوایەتی، یادی ئەو زاتە بەرزە بۆ بینەرو گوێگر دەگوێزنەوە.

لە پێناوی ئەوەدا وشەکانی خوا دەبنە باشترین بابەت بۆ مونەمنەمەکانی هونەری ئیسلامیی. لە سەدەی حەوتی زاینییەوە ئەو حەزە بەڕوونیی دەرکەوتوە، وەکو لە نەخش و نیگاری سەر (قبە الصخرە) ی قودس دەیبینین.

ئەو بینایە، کە چەندەها نەخش و نیگاری تێدایە، کە بە ئایەتەکانی قورئان نێو ئاخن کراون، لەسەردەمی خەلیفەی ئەمەویی، عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان، لە ساڵی (٧١ك–٦٩١ز) دروست کراوە.

لە ڕیگەی بەردەوام بەکارهێنانی عیبارەت و ئایەتەکانی قورئان و، زۆر نووسینیان، کارە هونەرییەکان لای میللەتانی مسوڵمان بەردەوام یەکتاپەرستییان وەبیر خەڵك هێناوەتەوە.



(قبة الصخرة) له قودسی پیرۆز، ساڵی ٦٩١ز دروستکراوه.
(بەمۆڵەتی وەزارەتی گەشتیاریی و شوێنەوارە ئیسلامیەکانی ئەردەن)

هەڵبەت تێگەیشتنی ئەو بابەتانەی قورئانی پرۆز، کە کاریگەر و گونجاو و بەرچاون، وەکو نەخش و نیگار و ئەو هونەرانەی لەگەڵیاندان، کاریگەرییەکی زۆری خستە سەر ڕۆشنبیریی و هونەرە ئیسلامییەکان– ئەم کاریگەرییانەش ئەو پێشکەوتنە خێراو سەیرەی خەتی عەرەبی و بردنی بەرەو کۆمەڵە شێوەیەکی بەردەست و، بڵاو بوونەوەی فرەوانی شێوازگەلی تایبەتی و جیاو، بەربڵاویی بەکارهێنانی ڕەگەزەکانی خەت لەکارە هونەرییەکاندا، دەگرێتەوە.

بەکارهێنانی ئایەتەکانی قورئان لە نەخش و نیگاردا، زۆر بە ڕیك و پێکی و شکۆو جوانیی ئەنجام دەدرا، هەر لە ئەنجامی ئەمەشدا بوو، کە هونەری خەت خۆشیی لە نێو مسوڵمانانی پێشوودا، بە داهێنانەوە زۆر بە

خێرایی بڵاو بۆوە. هیچ کام لەو خەتانەش کە لە پێش ئیسلامدا هەبوون، یان لە دوای ئیسلام پەیدا بوون، وەکو خەتی ئیسلامیی، بەردەست و گونجاو و زۆر بەکارهاتوو و بۆ خوێندنەوە ڕوون و ئاشکرا نەبوون.

درێژ کردنەوە و کورتکردنەوە لە درێژیی و پانیدا، لە کاتی نووسینی پیتەکاندا، بە چەند قاڵبێکی جیاواز لە شێوە و قەبارەدا ئەنجام دەدرا. زۆر شێوازی خەت بە جیا بەکار دەهات، یان دەخرایە پاڵ چەند بابەتێکی هونەریی کە هیچ پێوەندییەکی بە خەتەوە نەبوو. هەروەها گەلانی مسوڵمان چەندان شێوە خەتی وایان داهێنان کە چەندی بە بیریاندا دەهات گۆشە و سووڕانیان تێدا بوون. لە ڕاستیشدا بەشێك لە گرنگترین هەوڵە جوانیخوازییە هاوچەرخەکان لە جیهانی ئیسلامدا، لە دەوری ئەم بابەتە هونەرییەی کە لە نێو میللەتانی مسوڵماندا زۆر بڵاوە، دەخولێنەوە.

لەبەر ئەوەش کە هەر شتێك مسوڵمان دەیکات، یان بیری لێ دەکاتەوە، نیازێك یان پێوەندییەکی ئایینی دەگرێتەخۆی، ئەوە بەکارهێنانی وشەکانی خوا لە هەموو سیستەمێکی زەخرەفەیی گونجاودا، لە هەموو بوارێکی بیستن یان دیتندا، ئامانجێکی دڵخوازە.[1]

---

[1]. بڕوانە: Rene A. Bravmann. African Islam (Washington, D.C. Smithsonian Institution Press, 1983) Ch1;
- Clifford Geertz, "Art as Cultural System, "modern Lan-guage Notes, 91 (1976) pp. 1489-1490.




**زەریای هیند وەکو ئەحمەدی کوڕی ماجید کێشاویەتی (سەدەی ١٠ک/١٧ز)**



چنینێك بە ئایەتگەلی قورئـان لـە مالیزیـا (ئایەتەلکورسی، سوورەتی بەقەرە:٢٥٥) بە خەتی کـووفی هاوچـەرخ (وێنـەگرتنی لەمیا فارووقی)

بەکارهێنانی ئایەتەکانی قورئانیش لە زەخرەفەی ئەو بابەتانەدا کـە تـەنها بایـەخی ئایینییـان هەیـە، کـورت هەڵنایـەت، بـەڵکو ئایەتـەکانی قورئـان لـە ڕازاندنـەوەی تـەون و پۆشـاك و هـەوڕ و دەفـری خـواردن و خواردنەوە و سندووق و شمـەکی نێومـاڵ و دەرودیـوار و خانووبـەرەو، تەنانـەت مەنجـەڵی سـادەی شـێو لێنـانیش، لـە تێکـرأی سـەردەمی ئیسلامیی و، لە سەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا بەکار دەهێنرێن.

ئایەتەکانی قورئان لە ئەدەب و هونەرەکانی دەنگیشدا، لەوە کـەمتر باو و بەرچاو نین، چونکە بەهۆی بەکارهێنانی هونەری خۆشنووسیی لە نەخش و نیگاری ئایەتەکانی قورئاندا، هونەری ئیسلامیی کەوتۆتـە ژێـر

کاریگــەریی گــەورەی قورئــانی پــیرۆز، ئــەوە ســەرباری ئاراســتە جوانیخوازییــەکانی قورئــان، تەنانــەت کاتێــك نووســین، ئاماژەشــی بــۆ ئایەتەکانی قورئان نەکردبێـت، بۆ نموونە: عیبارەتی ئایینی یان پەنـدی پێشینان، یـان نـاوە پیرۆزەکـانی خـوا(أسمـاء الله الحسنی) یـان نـاوی پێغەمبەر (د.خ)، یان ناوی پیاو چاکان بووبێت، یان ئاماژە بووبێـت بـۆ درێژەی بیناسازیی، یـان نـاوی خێرخوازێـك، یـان هونەرمەنـدێك، ئـەوە هەمیشە پێ لەسەر دەرخستنی وێنەکانی خـەتی عـەرەبی داگیراوە بـە چەند شێوازێك کە خەیاڵ و جوانییەکی زۆری تێدا بووە. لە (ڕیبات)ەوە تا (مەنداناو)و لە (کانۆ) ڕا هەتا (سەمەرقەند)، ئایەتـەکانی قورئـان بـە خەتی عەرەبی، گەورەترین بابەتی هونەرییان پێکدەهێنا و، لـە هـەموو دنیادا هیچ کلتوورێکی جوانیخوازیی و، هونەری خۆشنووسیی و کتێبێك، ئەو ڕۆڵە گەورەی لە هونەردا نەدیوە.

لەم دواییانەدا چـەند توێـژەرێك دەربـارەی سروشـتی هێماکـاریی لـە هونــەری ئیــسلامیدا[1] شــتیان نووســیوە، هەنــدێك لــەو توێژەرەوانــە

---

[1]. بڕوانە:

- Martin Lings, The Quranic Art of Calligraphy and Illumination (London: World of Islam Festival Trust, 1976);
- Titus Bukhardi, The Art of Islam (London: World of Islam Festival Trust, 1976);
- Nader Ardalan And L. Bachtiar, The Sense of Unity (Chicago: University of Chicago press, 1973):
- Anthony Welch, Calligraphy in the Arts of the Muslim World (Austin: University of Texas press, 1979 ):

مسوڵمان نەبوون و، هەندێکیشیان مسوڵمان بـوون. بـەڵام لـە هـەردووك بـاردا، زۆربـەی ئـەو توێژەرەوانـە یـان لـە ژینگەیـەکی ڕۆژئـاوا لـەدایك بووبوون، یان لەوێ خوێنـدبوویان، ئـەوان کـە نێـوەڕۆکێکی هێمـایی لـە هونەرە ئیسلامییەکاندا دەبینن، ئەوە تەنها لەو هزرە ناسراوەدا کـورت هەڵنایەت کە دەڵێ: هونەرەکان ڕێبازی دەربڕینی بیری ڕەهان بە شیعر، یان ڕەنگ، یان خەت، یان شێوە، یان دەنگ و شتی لـەو بابەتـەو، بـەو واتایە، هونەر بە شێوەیەکی ئاسـایی هـەمووی دەبێـتە هێمـایی. بـەڵام ئەو نووسەرانە، ئەو خەسڵەتانەی لە هونەری ئیسلامیدا دەیاندۆزنـەوە، زۆر لەو شتانە زیاترن کە نێوەڕۆکە هێماییەکان وەخۆیان دەگرن.

ئەوان پێیان وایە بیچم و شـێوە و شـت و دیمەنـەکان و، تەنانـەت پیـت و ڕێنووسە بەکارهاتووەکانی نێو هونـەری ئیـسلامیش، چـەمکێکی "نـاوەکیی" یان هەیە. هـەروەکو چـۆن شـێوە بازنەییـەکانی "مانـدالا" یـان کۆڵەکـە زۆر بەرزەکان، یان وێنەکێشانی خواکان لە شێوەی مرۆڤدا، لە لای هیندۆکـەکان ماناگەلی ئایینییان هەن و، خاچ، یان دیمەنی لەخاچدان و پەیکـەری مەسـیح

---

- Erica Cruikshank Dodd, "The Image of The World, "Berytus 18 (1969) pp. 35-58.
- SeyyedHossein Nasr, "The Significance of the Void in the Art and Architecture of Islam"The Islamic Quarterly, 16 (1972), pp. 115-120.
- Annemarie Schimmel, "Schriftsymboilkim Islam " IN Aus der Welt der islamischenkunst: Festschrift fur Ernst kuhnel, ed.RichardEttinghausen (Berlin, 1959).pp244-254:
- Schuyler van R. Cammann, "Symbolic Meanings in Oriental Rug Patterns. "The Textile Museum Journal. 3(1972) pp. 5-54:
- Idem,"Cosmic Symbolism on Carpets from the SanguszkoGroup,"Studies in Art and Literature of the Near East in Hon- or of Richard Ettinghausen, ed. PrterJ.Chelkovski (Salt Lake City and New York, 1975), pp. 181-208.

لای مەسیحییەکان، لە هێما گرنگەکانن، ئەو نووسەرانە پێیان وایە "چەند هێمایەکی ئیسلامی"ش کە تایبەتین، بەشێوەیەکی بینراو، گەلێك مەبەست هەڵدەگرن، کە دەبێ بینەر بیانزانێ و تێیان بگات. هەرچەندە ئەو بابەتە هونەرییانە، یان ئەو هێمایانەی ئەو زانایانە لێیان دەدوێن، بە باوەڕی ئەوان تایبەتن بە ڕۆشنبیریی ئیسلامیی، "مەنتیق"ی جوانیخوازیی لەو بابەتانەدا، لەو شتانە دەچێت کە پێوەندییان بە کلتووره هونەرییەکانی دیکەوە هەیە. ئەوەتا گومبەز وەك گومبەزی ئاسمان[1] دیتە بەر چاو و، ڕازاندنەوەی نێوەڕاستی بەرماڵ و شینیی[2] لەڕازاندنەوەی دەستنووساندا، هێمای بێ کۆتایی، واتە: خوایەو[3]، نووسینی ناوی کاربەدەست لە پەڕاوێزی نامە نووسراوەکاندا، هێمایەکە جێی دەستەڵاتی سیاسیی[٤] دەگرێتەوە، بەڵکو یەکە لە دیاریدانەکانی خواو[5]، تەنانەت "بۆشایی"بە"هێمای خوای باڵادەست و ئامادەبوونی لە هەموو شتەکاندا"[٦] دادەنرێت.

---

[1]. بڕوانە: Burckhardt, Art of Islam, ch 4.

[2]. بڕوانە: **Cammann, "Symbolic Meanings" and Cosmic Symbolism on Carpets".**

[3]. بڕوانە: Lings, Quranic Art, pp. 76-77.

[4]. بڕوانە: Welch, Calligraphy p. 23.

[5]. بڕوانە: هەمان سەرچاوەی پێشوو.

[6]. بڕوانە: Nasr, "Significance of the Void," p. 116.



هەڵکۆڵین لەسەر دار بە خەتی سولوس، لە باشووری تایلەند، سەدەی نۆزدەهەم،
عیبارەتی ڕێزلێنانی نەناسراوێك
(بە مۆڵەتی مۆزەخانەی هونەری ئاسیا، زانکۆی مالیزیا، کوالالامپوور)

هەموو ئەو هێما پیتییانە، پێچەوانەی نێوەڕۆکی هونـەری ئیـسلامین و، لەگەڵ سروشتە ڕەهاکەی ناگونجێن، چـونکە هونـەری ئیـسلامیی لـە ژینگەیەکی بەرزدا، کە دژی هەموو جۆرە وێنەو پەیکەر دانانێکە بۆ زاتی باڵا، لەدایك بووە و گەشەی کردوە. ئەو هونەرە لەسـەر بنـەمای فکـری "یەکتاپەرستی"، کەناکرێ بە پێوەندیی کردەیی، یان خەیاڵیی لەنێوان سروشت و خوادا، لە ڕووی جوانیخوازییەوە دەرببڕێـت، بنیـات نـراوە، چونکە ئەو جۆرە پێوەندییە سەر دەکێـشێ بـۆ"هاوبـەش پەرسـتیی"، یان دروستکردنی پێوەندیی لە نێوان خواو شـتی دیکـەدا، ئـەم شـتەش ئیسلام بە ناحەزترین شت، بەڵکو بە گەورەترین گوناحی دەزانێـت.



وێنەی زەویی وەکو ئیبن یوونسی میسریی کێشاویەتی،(٣٣٩ک/٩٥١ز).

ئەم بیر و باوەڕ و گریمانانە، خەسڵەتێکی ناهێمایی نایابن لە ئـاییـنی ئیسلام و ڕۆشنبیرییەکەیدا.

زۆر جاریش بینراوە کە دروشمەکانی ئیسلام بۆخۆشـیان لـە کاکـڵ و نێوەڕۆکدا ئەرکین، نەك هێمایی. ئـەوەتا بـانگ و، تەنانـەت بڵێنـدگۆش بۆخۆی، لە ڕەگەزەکانی بیستن یا بینینـی هێمـایی نـین، چـونکە بـانگ کردارێکە مەبەستی یارمەتیدانی مسوڵمانانە بۆ کۆبوونـەوە بـۆ نوێـژ لـە چەند کاتێکی دیاریکراوی ڕۆژدا و، بڵێندگۆش ئامرازێکی تەلارسازییە بۆ ئاسانکردنی ئەو کردارە.[١]

---

[1]. بە پێچەوانەی نهێنییە پیرۆزییەکانی مەسیحیەت و، دروشمەکانی خوین ڕشتنی پیرۆز لای هیندۆسەکان.

میحرابیش پێویستی بەوە نییە لە لایەن نوێژکەرانەوە بەچاوێکی تایبەتی تەماشا بکرێت و، شوێنەکەی لە هیچ جێیەکی دیکەی مزگەوت[1] پیرۆز تر نییە و، مانگی یەکشەوە"هیلال"یش، کە هەمیشە نامسوڵمانان بە ئیسلامیانەوە بەستۆتەوە، لە ڕۆشنبیریی ئیسلامیدا[2]، هێمایەکی بینراوی خاوەن چەمکی ئاینی نییە.

بەڵکو دروشمێك بوو، کاتی خۆی سەربازانی عوسمانی بەخۆیانەوە هەڵدەواسی، ئەوروپییەکانیش پێیان وابوو هێمای ئایینی ئیسلامە. لەبەرئەوەی خاچیش هەر زۆر زوو بوو بە هێمای مەسیحیەت، ئیدی یەکسەر ئەوروپییەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامگیرییە هەڵەی، کە ئیسلامیش مانگی یەکشەوەی لە بەرانبەر خاچدا کردۆتە ڕەمز.

گومانیشی تێدا نییە ئەم ڕاستییانە بۆ ئەو کەسانەی لە هونەری ئیسلامیی دەکۆڵنەوە، چ مسوڵمان بن، چ نامسوڵمان، ئاشکران، کەواتە سەیرە ئەو توێژەرەوانە لەسەر لێکدانەوەی ئەو هونەرە، بە ڕێگایەك کە پێچەوانەی ڕەگەزەکانی دیکەی ڕۆشنبیریی ئیسلامییە، سوور بن.

---

[1]. بە پێچەوانەی چەمکی کوشتارگا لە کاتدرائیەی کاسۆلیکیدا و، پەیکەری خوا لە پەرستنخانەی هیندۆکیدا.

[2]. بڕوانە:

Tomas Arnold, "Symbolism and Islam, " The Burlington Ma-gazine, 53 (July – Dec., 1928), pp. 155-156.



وێنەی زەویی وەکو سەفاقیسی کێشاویەتی (سەدەی ٤ك/ساڵی ٩١٠ز)

لەوانەشە ئەم گریمانانەی خوارێ، یارمەتیی زانینی هۆی پابەندبوونی ئەو توێژەرەوانە، بەو جۆرە لێکدانەوانە، دەربارەی مانای تێکڕایی هونەری ئیسلامیی بدەن.

یەك لەو گریمانانە پێی وایە ئەو نووسەرانە ئەوەندە لە ژێر کاریگەریی لێکدانەوەکانی هونەری ڕۆژئاوادان، ئەگەر مەحاڵیش نەبێت، زەحمەتە لەو لایەنگیرییە شارستانییانەی لەمەڕ ڕەفتارکردن لەگەڵ هونەری ئیسلامیی هەیانن، دەربازبن. جێی داخیشە، وا دیارە ئەو بناغانەی لێکدانەوەکانی هونەری مەسیحیی ئەورووپی لەسەریان بەندن، بۆ نێو بواری هونەری ئیسلامیی گوێزراونەتەوە، کە ئەمەش بە هیچ جۆرێك ناگونجێت.




گومانیشی تێدا نییە، کە ئەو کارە لـە کـاتی ئەنجامـدانی لێکۆڵینـەوەی بەراوردکاریی و، بەنێو یەکداچـوونی ڕۆشـنبیریی بەشـێوەیەکی گـشتیی و، هونەری ئیسلامی بەشێوەیەکی تایبەتی وریایی و پـارێزی زۆر و، زانیـاریی قووڵ و، دوورکەوتنەوە لە سۆزداریی دەوێت.

هۆکـاری دووەمـیش بـۆ ئـەو لێکدانـەوە هێماییانـەی لـەم دواییانـەدا دەربـارەی هونـەری ئیـسلامیی بڵاوبوونـەوە، ئەوەیـە کـە بـواری جوانیخوازییەکان و مێژووی هونەر، چەند توێژەرەوەیەکی ڕۆژئاوایی، یـان لە ڕۆژئاوا خوێندوو، دەستیان بەسەردا گرتووە و، ئـەم بـوارە لـە جیهـانی ئیسلامدا هەندێك کەمتەرخەمیی پێوە دیارە، بە جۆرێك گەلێك لـە خـاوەن بـەهرەکانی نێوخـۆ ئاوڕیـان لێ نەداوەتـەوە، کـە بۆتـە هـۆی ئـەوەی ئـەو کەسانەی لەڕووی ڕۆشنبیریی و ئاینییەوە لە دەرەوەی ئیسلامن، دەستی بەسـەردا بگـرن —سـەرباری ئـەوەش دەبیـنین کـۆلیج و زانکۆکـانیش لـە

جیهانی ئیسلامدا، هێنده گوێیان نەداوەتە توێژینەوەی جوانیخوازیی و مێژووی هونەر، کە وای لەو مسوڵمانانە کردوە کە بایەخ بەو جۆرە توێژینەوانە دەدەن، نزیکەی بە بێ هەڵاواردن، ڕوو لە پەیمانگاکانی ڕۆژئاوا بکەن بۆ خوێندن لەژێر ڕێ و شوێنی مامۆستایانی ڕۆژ ئاواو کاریگەریی بنەڕەتە هونەرییەکانی ڕۆژ ئاوا. بۆیە لە ئەنجامدا توێژەرە مسوڵمانەکان، چ ئەوانەی بە مسوڵمانی لەدایك بوون، چ ئەوانەی پاشان بوونەتە مسوڵمان، بەزۆریی بەقەدەر هاوتا نامسوڵمانەکانیان کەوتنە ژێر کاریگەریی لێکدانەوە خراپەکانی کە بێگانەکان لەسەر هونەری ئیسلامیی کردوویانن.

هۆی سێیەمیش بۆ ئەوەی کە لەم دواییانەدا نێوەڕۆکێکی هێمایی حەرفی زەق، درایە پاڵ هونەری ئیسلامیی، کە پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی، کە خەسڵەتی ڕەهاییە، کاریگەریی سۆفیگەرییە لە ئیسلامدا، چونکە سۆفیگەریی سەرباری پێ داگرتنی لەسەر ئەزموونی کەسیی ناوەکیی لە ئاییندا، بنەڕەت و بیرو باوەڕێکە جەخت لەسەر خەسڵەتە نادیار و شاراوەو سیحراوییەکان لە ئاییندا دەکات. جا ئەوە هەم دەربارەی بیری سۆفیگەریی لە ئیسلامدا ڕاستە، هەم دەربارەی مەسیحیەت و هیندۆکیی و یانیەی هیندی و جوولەکە و ئایینە بۆماوەییەکانی دیکەش. سۆفیەکان چەند مانایەکی شاراوەیان دەدایە پیت و وشە و عیبارەتەکان و، هەموو جۆرە شێوەو بابەتە بینراوەکان.

جا لەبەر ئەوەی بە جۆرەها ڕێگە هەوڵیان دەدا بگەنە پلەی "نەمان– الفناء"، ئەوەندە گوێیان نەدەدایە لێك جیاکردنەوەی

ئاشــکرای هــەردووك بــواری بــاڵایی و سروشــتی، کــە خەســڵەتی جیاکەرەوەی ئیسلامی ڕاستەقینەو بنەڕەتی "یەکتاپەرستیی"یە.

ناکرێ نکوولّیی لە بوونی ئـەم جـۆرە بیرانـە لـە مێـژووی ئیـسلامدا، یـان بڵاوبوونەوەی هەندێك کردارو لێکدانەوەی شاراوە بکرێـت، کـە لـەو بیرانـەوە سەریان هەڵداوە بـەڵام ئـەم ڕاسـتییانە، نـابێ لـە لێکدانـەوەی تێکـڕای ئـەو دیاردەی بە هونەری ئیسلامیی ناسراوە، زیاتر لەوەی هەڵدەگرن، بایـەخیان پێ بدرێ. هەرچەندە سۆفییەکان دەیانەوێ بڵێن دامەزرێنـەری سـۆفیگەریی پێغەمبــەر " درووودی خــوای لەســەر " خۆیــەتی، بــەڵام بزووتنــەوەی سۆفیگەریی دوای چەندان سەدە لە کۆچی دوایی پێغەمبەر "درووودی خوای لەسەر"، ئەوجار هێندە بوو بـە جێـی بایـەخ و، پـەرەگرتنی بەربڵاویـشی لـە چەند ماوەیـەکی مێـژووی ئیـسلامدا، نـاکرێ بکرێتــە بیـانووی گەشـەکردنی سەرپاکی هونەری ئیسلامیی. هەڵبەت هونەرێکی ئیسلامی سەربەخۆ، هەر لە سـەدەی یەکـەمی کۆچـییەوە سـەری هەڵـدابوو، دیـارە لـەو سەردەمەشـدا سۆفیگەریی ئەوەندە بڵاو نەبوو بـۆوە.. (قبـە الـصخرە) کـە عەبدولمـەلیکی کـوڕی مـەڕوان لـە قـودس دروسـتی کـرد "٧١ك/ ٦٩١ز" هـەموو پێکهێنـەرو خەسڵەتەکانی هونەری ئیسلامیی– واتە: هونەری قورئانیی– تێدان، ئەوەش زۆر پێش بڵاو بوونەوەی سۆفیگەرییە، کە دەستی بە زیـادکردنی لێکدانـەوە هێمایيە حەرفییەکان بۆ هونەری ئیسلامی کرد.

هەڵبەت (قبە الصخرە)ش، بەرهەمی بیرێکی ئیسلامی سۆفیانە نییە، لەبەر ئەوە دەبێ لێکدانەوەیەکی جوانیخوازیی دەربارە بکرێـت، کـە بـە شێوەیەکی گشتیی لە گەڵ ئیسلام بگونجێت.



نەخشێك بە خەتی هەڵكەنراو (سوورەتی بەقەرە: ٢٨٥) لەسەر گومبەزی گۆڕی سوڵتان قایتبای، قاهیرە، ١٤٧٢–١٤٧٤ز (وێنەگرتنی: م. ئەشرەف).

بێگومان زێدەڕۆییە ئایینی و كۆمەڵایەتییەكانی هەندێك لە تاقمە سۆفییەكان، ناوبانگێكی خراپی لە زۆر وڵاتی مسوڵمان نشیندا داوەتە سۆفیگەریی[1]... ئەو حەزانەی لەسەر خودی تاك كۆ دەبنەوەو ڕوویان لە دەروونە، مسوڵمانە نوێگەرەكان بە یەكەم هۆی ئەو مل كەچیی و زەلیلییەی دەزانن گەلانی مسوڵمان لەسەر دەستیی هێزە ناوخۆیی و دەرەكییەكان تووشی بوون.

---

[1]. سۆفیگەریی ئەگەر بە ڕێك و پێكی و دوور لە زێدەڕۆیی بەكار بێت، لایەنی ڕووحیی ئیسلامە و، ئامرازی پاككردنەوەی دڵ و دەروونەو، خواناسە مەزنەكانی وەك "شێخی گەیلانیی" و "ئیمامی غەزالی"و "مەولانا خالیدی نەقشبەندیی" و ... هتد ڕۆڵێكی بەرچاویان لە هۆشیار كردنەوەو بەرچاو ڕوونكردنەوەی مسوڵمانانداندا دیوە. "وەرگێڕ"

دەشگوترێت پێ داگرتنی لە ڕادە بەدەر لەسەر تەقوای کەسیی، لەسەر حیسابی جەخت کردنی ئاسایی ئیسلامە، لەسەر وەدەست هێنان و گەشەکردن و پێشکەوتنی تاك و کۆمەڵ پێکەوە. هەروەها ئەو لادانە لە پێوەربەندیی(المعيارية)، هەوڵی بەدیهێنانی هاوسەنگی لە نێوان"دین" و "دنیا" ی لاوازکردوەو، کردوویەتە بایەخدانێکی لە ڕادەبەدەر بە قیامەت ... لەبەر ئەوە بزووتنەوە ئیسلامییە تازەکانی چاکسازیی و نوێگەریی بەشێوەیەکی گشتیی، لەگەڵ سۆفیگەریی ناکۆکن، هەروەها سەرۆکایەتیی هاوچەرخی ئیسلامیی نەتەوەی مسوڵمان، بە گشتیی لە سۆفیگەریی دوورە و، زۆرجار پێچەوانەشیەتی.

هەرچەندە زۆربەی ئەو مسوڵمانانەی لە جیهانی ئیسلامدا دەژین، سەر بە کۆمەڵەکانی سۆفیگەریی نین و، زۆریان بە چاوی گومان لەو ڕێکخراوانە و چالاکییەکانیان دەڕوانن، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵەیە بڵێین: بزووتنەوەی سۆفیگەریی لە ئیسلامدا نییە، بەڵام پاش ئەو لێك هەڵوەشانەی دوای داگیرکاریی مەغۆل و شەڕەکانی خاچپەرستان و شوێنەوارەکەیان لەمیانی پووکانەوەی دەستەڵات و زیادبوونی پەرتەوازەیی سیاسیی، دەستەڵاتی سۆفیگەریی لەسەر خەڵك وەك جاران نەما — لەڕاستیشدا سۆفیگەریی بە پلەی یەکەم لە ئەورووپاو ئەمەریکا گەشە دەکات، جا چ بە کردەوە لەنێو کۆمەڵانی خەڵکدا، یان بە بایەخ پێدانی زانستیی و توێژینەوە و بڵاوکراوە. لەو وڵاتانەدا، سۆفییە مسوڵمانەکان گوێیان لێ دەگیرێت و خاوەنی پلە و پایە و ڕێزن ... ڕۆژ ئاواییەکان لەوێ — کە وازیان لە ڕێ و ڕەسمە ئایینییەکانی پێشوویان هێناوەو، بە بێ هیچ لەنگەرێکی دینیی

دەسووڕێنەوە– ئێستا لە ئەنجامدانی سۆفیگەریی ئیسلامیدا، بایەخ بە نامۆکاریی و شتی سەیر دەدەن و، پشتگیریی لەو گیانە ناوەکییەی لە سۆفیگەریدایە، دەکەن. ئەو پاشماوە ڕووحانیەتەی لە مەسیحیەت و ئایینی جوولەکەدا ماوە، بە زۆریی ئەوەیە کە بابای ڕۆژ ئاوایی، بە ڕەگەزەکانی سۆفیگەریی ئیسلامیی دەگەیەنێت. لە ڕاستیشدا ژمارەیەکی زۆر لە ئەنگلۆ سەکسۆنییەکان، لەم سالآنەی دواییدا، لە ژێر کاریگەریی بزووتنەوە سۆفیگەریەکاندا مسوڵمان بوون. زۆربەی ئەو توێژینەوانەش، کە لە لێکدانەوە هێماییەکانی هونەری ئیسلامیی دەکۆڵنەوە، لە لایەن ئەو تاقمانەوە کە بوونەتە مسوڵمان، نووسراون، کە یان لە چینی بالآی ڕۆشنبیرە سپی پێستەکانی ڕۆژ ئاوان، یان لە هاوتا ڕۆژ ئاواییە نا مسوڵمانەکانیانن.

بێگومان لێکدانەوە هێماییە حەرفیەکانی سۆفیگەریی لە نووسینە تازەکاندا، پێچەوانەی ئەو ڕەهاییەیە کە لە لای گەلانی مسوڵمان و لە بەرهەمە هونەرییەکانیاندا، لە هۆشیاریی جوانیخوازیدا ڕۆچووە... هەروەها لەگەڵ دژایەتی ئیسلام لە بەرانبەر هەر جۆرە کردەوەیەکی هونەریی لە مەڕ زاتی خواو کاروباری پەروەردگاری بالآدەست، نایەتەوە. ڕەنگە ئەو جۆرە لێکۆڵینەوانە، بە دڵی توێژەری لە ڕۆژ ئاوا خوێندوو، یان سۆفی بن، بەڵام بە شێوەیەکی سەرلەبەر و گونجاو، بۆ لێکدانەوەی هونەرە ئیسلامییەکان ناشێن.



وێنەی: ٨–١٦ ، بڕگەیەك لە دەربارى شووشەبەند كە لەسەر ئیفریز بە خەت نەخشاوەو، گۆڕەكانى سەعدییەكان دەڕازێنێتەوە، مەراكیش، مەغریب ١٥٧٨–١٦٠٣ز
(وێنەگرتنى لەمیا فاڕووقیى)

هەڵبەت بیردۆزەی قبوولكراو و بەجێ لە هونەری ئیسلامیدا، ئەو بیردۆزەیە كە گریمانەكانی دەباتەوە سەر ئەو ڕەگەزانەی لە ئایین و ڕۆشنبیرییەوە هەڵقولیون، نەك لەو دەستكەوتانەی لە كلتوورێكی بێگانەوە بەسەریدا سەپێنراون... ئەو بیردۆزەش پشت بە گرنگترین ڕەگەزەكانی ئەو ڕۆشنبیرییە دەبەستێ، نەك چەند ڕەگەزێكی لاواز، یان لاوەكیی، كە كاری تێ بكەن.

بێگومان لە بەرانبەر ئەو داخوازیانەشدا، قورئانی پیرۆز داهێنانی جوانیخوازیی، بەسەرچاوەیەكی حازرو مەنتیقی ئیلهام، پشت ئەستوور

**دەکـات. قورئـانیش بەقـەدەر کاریگـەریی لەسـەر لایەنـەکانی دیکـەی ڕۆشنبیریی ئیسلامیی، کاریگەریی لەسەر هونەر هەبووە.**

**بێگومـان قورئـانی پـیرۆز، ئـەو پەیامـەی دەبـێ بەشـێوەیەکی ئیستاتیکیی دەر ببڕێت، خستۆتە ڕوو، هەروەها ڕێبـازی دەربڕینیـشی خـستۆتە ڕوو، هـەروەکو لـە شـەش خەسـڵەتەکەدا، لـە ڕوخـسارو نێوەڕۆکیـدا دەردەکەوێـت. تەنانـەت قورئـانی پـیرۆز تـەعبیرە تایبەتییەکانی و بەشەکانی خۆی، وەك گـرنگترین بابـەتی وێنەکێشانی وردی هونـەریی پێـشکەش کـردوون، لەبـەر ئـەوە بەڕاسـتی لـە جێـی خۆیدایـە، هونـەرە ئیـسلامییەکان پێیـان بگـوترێ: "هونـەرە قورئانییەکان"**